# سیفاتی زاتی و فیعلی الله ﷻ

بسم الله الرحمن الرحيم ، الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على نبينا محمد وعلى آله وصحبه ،

أما بعد :

ئایا دروستە سیفەتەکانی الله ﷻ بۆ سیفەتی ذات و سیفەتـی فعل دابەش بکرێ ؟

لەبەر ئـەوەی کەسێـک لە تیلیگرام پـرسیاری ئـەوەی لێـکراوە ئەویـش وتوویەتی لەناو سەلەف شتـی لەو شێوەیەی تێدا نەبووە و بیدعەیە بەڵـکو یەکەم کەس ئەوەی کردووە ئەهلی کەلام بـوون! بۆیە دروسـت نییە و تەنها دەبێ بوترێ سیفەتەکانی الله و هەر ئەوەندە.

بەر لەوەی بڕۆمە سەر وەڵامی پرسیارەکە ئەمەوێت ئەوە ڕوون بکەمەوە کە واتای سیفەتی زات و سیفەتی فیعل چییە ؟

سیفەتی زات : کە بۆ الله بەکار هات مەبەست لەو سیفەتانەیە کە لە الله جودا نابنەوە و کارێک نین تاوەکو الله ئەنجامیان بدات ، وەکو سیفەتی چاو و دەست و پێ و ڕوخسار و باسک و سنگ و هتد ..

**سیفەتـی فیعل : بـۆ الله مەبەست لێــی ئـەو شتانەیە کـە الله ئەنجامیان ئەدات و پەیوەستن بە وویستی الله وە ﷻ وەکو سیفەتی دابەزین بەرزبوونەوە سزادان و پاداشت دانەوە و پێکەنین و تورە بوون و هتد..**

**جا پرسیارێک لێرە هەیە :**

**ئایا سـیفەتـی دەستــی الله لە جـۆری سیفەتــی پێکەنینی الله ــیە ؟ یان سیفەتی چاوی الله هاو وێنەی سیفەتی ڕازی بوون و تووڕە بوونی الله ــیە و هتد ؟**

**بێ گومان نەخێر ڕازی بــوون و تورە بــوون و پێکەنیــن و خۆشویستــن سزادان و پاداشتکردن و هتد کۆمەڵە سیفەتێکن جودان لە سیفەتەکانی وەک دەست و پێ و لاق و چاو و ڕوخسار و هتد ، لەبەر ئەوەی ئەوان هەموو کات لەگەڵ الله نین و جودا دەبنەوە لێی بەو واتایە الله هەموو کات پێناکەنێـت و هەمــوو کات تــوڕە نییە و هەمــوو کات ڕازی نییە و لە هەمــوو کەسێک وە بەو جۆرە ، بەڵام هەموو کات الله دەست و چاو ڕوخسار و هتد لەگەڵ لەسەر عەرش بێت یان دابەزێتە ئاسمانی دونیا ئێستە بێت یان لە ڕۆژی دوایی.**

**دواتر دەبێ بزانین کە هەموو شتێک گەر کۆمەڵەیەکی گومڕا ئەنجامیان دا یاخود ووتیان ، واتای ئەوە نییە کارەکە نادروستە و نابێ بکرێت ، بەڵکو مەرج بۆ ئەوە بەتاڵــی شتەکەیە وە دەبــێ بیــدعەکە بیدعەیەکـی فیسقــی یان**

کوفری بێت نەک تەنها بیدعەی زمانەوانی بێت ، چونکە گەر شتەکە خۆی پێچەوانەی قورئان و سوننەت و عەقیدەی سەلەف نەبێت ئیدی ئاساییە کێشەی تێدا نییە بەکار هێنانی زاراوەیەک کە پێشتر بەکار نەهاتبێت یان بە جۆرێکی دیکە بەکار هاتبێت بەڵام گەر بەکارهێنانی ئەم زاراوانە حەق بێت ئەوە حەق لە هەموو کەس وەردەگیرێت بگرە لە شەیتانیش.

ئەمما سەبارەت بەوەی ئەم دابەشکاریە لە نێو سیفەتەکانی الله ﷻ لە قورئان و سوننەت هیچی لەسەر هاتووە یاخود نا... ؟

دەڵێم :

شتێکی زۆر بەدیهیە کە دەربڕین و قسەکردن سەردەم بۆ سەردەم دەگۆڕێ و گۆڕانکاری بەسەردا دێت سەردەمی ئێمە و قسەکردنمان وەکو ٥٠ ساڵ پێش ئێستە نییە چ جای ١٤٠٠ ساڵ!

بۆیە شتێکی ئاساییە کە من مەبەستێک بە جۆرێک دەرببڕم کەسێکی پێش من بە جۆرێکی دیکە دەری بڕیبێت کەسێکیش کە لە دوای من بێت بە جۆرێکی دیکە دەری ببڕێت بەو مەرجەی هیچمان لەفزێکی حەرامان بەکار نەبردبێت یان لەفزێکمان بەکار نەهێنا بێت کە کاریگەری لەسەر مەبەستەکە دروست بکات و تێکی بدات ، هەر بۆیە دەبینین لەدوای سەدەی سێیەمەوە وردە وردە شیکاری و زۆر ڕونکردنەوە ڕوی لە زیاد بوونە لەبەر پێویستیەکە

که پێشتر بوونی نەبووە وە بەتایبەت لەو بابەتانە کە ئەهلی ئەهوائـ قسەیان تێدا کردووە خەڵکیان بە لاڕێدا بردووە تیایاندا ، یان لەبەر بەربڵاوی جەهل لە هەموو ڕوویەکەوە ، جا ئەبینین قسەکردنی ئێستە لەهی ئەو سەردەمە ناچێت چ جای لە هی پێش ئەوان ، ئەمما گەر سەرنجی ئەوە بدەین کە لەو کاتەوە تاوەکو ئێستە ڕەنگە هیچ شتێک نەبێت گۆڕانکاری بەسەردا نەهاتبێت هەر لە جل و بەرگ و هەڵسوکەوت و خواردن و هەموو بوارەکانی ژیان وە زانست و نەزانین و گومڕایی و هیدایەت و عەقڵ دڵ و هتد ، پێویستە ئیللا قسە کردنیش سادە تر بێت وەک لە جاران ئەبێت گۆڕانکاری بەسەردا هاتبێت جا ئەم گۆڕانکاریە مرۆڤ ناچار ئەکات لە بابەتە دینیەکان شتانێک بکات تاوەکو توراسی زێڕینی سەلەف بپارێزێ نەک بۆی زیاد بکات و تێکی بدات ئەو ئامانجە وردانە ڕوونبکاتەوە و دەریان بخات کە ئەوان لە پشت قسەکانیانەوە مەبەستیان بووە ، ئەمەش فەزڵە نەک بیدعە.

جا ئێستە ئێمە دەستەواژەی سیفەت بۆ الله بەکار ئەهێنین کە موشتەققاتی لە قورئان هاتووە و بە سەریحی لە سوننەتیش باسکراوە و سەلەفیش بەکاریان هێناوە ، ئەمێنێتەوە ئیزافە کردنی لەفزی فیعل یان زات بۆ دەستەواژەی سیفەتەکە ئەم دوانەش لە قورئان و سوننەت باس کراون :-

**أبو هريـرة** ﷺ دەگێـڕێتـەوە : **پێغەمبەر** ﷺ دەفـەرمـێ : ابـراهـیـم پێغەمبەری الله ﷺ درۆی نەکردووە تەنها سێ درۆ نەبێت : دوانیان لە پێناو زاتی الله بوون.

[صحيح مسلم ٢٣٧١ ]

جا لێرە دەستەواژەی زات بۆ الله بەکاردێت و جێگیرە ، ئێستە دەپرسین زاتی الله چییە ؟

مەگەر هەر ئەوە نییە کە دەستی هەیە و چاوی هەیە و ڕوخساری هەیە و پێی هەیە و وێنەی هەیە و هتد .. ، واتە کەس نکۆڵی لەوە دەکات کە ئەوتریّ زاتی الله ئەو نەفسە دێتە دڵ کە بەو شێوەیە وەسفی خۆی پێ کردووە ؟

بە دڵنیاییەوە نەخێر.

ئێ باشە دەپرسین هەریەکێک لەمانە سیفەتن یان سیفەت نین بۆ الله ؟

خۆ گەر بووترێ سیفەت نین بۆ الله ئەمە کوفرە معاذ الله.

وە دەپرسرێ : ئایا ئەم سیفەتە لە زاتی الله یە یان لە زاتی الله نییە ؟

ئەبێ بڵـێ یان لە زاتـی الله ، ئەو کاتە کە ئـەوەی ووت وتوویەتـی هەر یەک لەوانە سیفەتی زاتین بۆ الله .

وە گەر ووتیشـی نا ، دەبـێ جێگیر بکات کـە بزانین سیفەتـی چییە ئەو کات ئەبێ بڵێ کردەوەی الله ئەمەش هیچ عاقڵێک نایڵێت .

وه دەربـارەی کـردەوەکانـی الله بێگومان دەبـێ بڵـێ سیفەتـن ، پاشان دەپرسین لەو سیفەتانەن کە الله ئەنجامیان دەدات یاخود لەوانەن کە ئەنجام نادرێن و پەیوەست بە الله ـوە ﷻ ؟

بێ گومان لەو شتـانەن کە ئەنجام ئەدرێـن و بەردەوام نیـن لەگەڵ الله تعالی ، واتە بۆ نموونە الله ﷻ هەموو کاتێک پێناکەنێت و هەموو کاتێک تورە نابێت و هەموو کاتێک دانابەزێتە ئاسمانی دونیا بەڵکو هەمووی کاتی تایبەتی هەیە .

بەهەمان شێوە بۆ ئەمانەش یان دەبێ بڵێ سیفەت نییە و خۆی تووشی کوفر بکات ، یان دەبێ بڵێ ئەمە فیعل و کردەوەی الله نییە ئەمەش لە کوفر نزیکە ئەوکاتە مولزەم ئەبێت کە بەیانی بکات ئەی کردەوەی الله نییە چییە کەوایە ؟

الله ﷻ دەفەرمێ : ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُواْ فَفِي ٱلنَّارِ لَهُمۡ فِيهَا زَفِيرٞ وَشَهِيقٌ ۝١٠٦ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَۚ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٞ لِّمَا يُرِيدُ ۝١٠٧﴾ [هود]

واتە : بەڵام ئەوانەی کە چارە ڕەش بوون واتە کافر بوون لە دونیا ئەوە لەناو ئاگردان جا زەڕە زەڕیان وەک زەڕەی گوێ درێژ وایە کە چۆن سەرەتا زەڕەی لە قوڕگەوە دێت و زۆر بەرزە دوایی وورده وورده لاواز دەبێت و دەنگی کز دەبێت و لە سنگیەوە نووزە نووز دێت ،

جا له ئاگردا دەمێننەوە بە هەمیشەیی تاوەکو ئاسمانەکان و زەوی بمێنن « وەک الطبري دەڵێ : ئەوە عیبارەتە لە مانەوەی هەمیشەیی چونکە عەرەب کاتێک بیوتایە شتێک بەهەمیشەیی دەمێنێتەوەدەیوت: ئەوشتە دەمێنێتەوە تاوەکـو ئەو کاتەی ئاسمـان و زەوی بمێنـن بـەو واتایـەی بـە هەمیشـەیـی دەمێننەوە » تـەنها ئەوانە نەبێت کە پەروەردگارت خۆی ئەیەوێـت نەمێننـەوە « ئەوانیـش باوەڕدارانـن کـە لەسـەر تاوانـەکانیان چـوونـەتـە ئاگـر » جـا پەروەردگارت هەر شتێک وویستی لەسەری هەبێت ئەنجامی دەدات « هەر کارێک وویستی لەسەری هەبێت ئەنجامی دەدات ».

شـاهیـد لێـرە فەرمـایشتـی پەروەردگارە کـە دەفەرمـێ : فعال لما يريد ، واتە وویستی لەهەر کارێک هەبێت دەیکات .

ئەمە تەرکیبی ئیزافی پێ دەوترێ لە زمانی عەرەبیدا دوو لەفز کە هەر دووکیان لـە قورئـان و سوننـەت بە جودا جێگیـر بـوون و هاتـوون وە واتاکانیشیان بە تێهەڵکێش کراوی لە قورئان و سوننـەت دەبینرێن تەنها بە لەفزی نەهاتوون ئێمە لەفزەکانمان داوەتە پاڵ یەکتری بۆیە ئەمە دوور و نزیک هیچ پەیوەندی بە کەلام و زانستی کەلامەوە نییە و نەبـووە هیـچ کات بەڵکـو ئـەم زاراوانە و ئـەم دابەشکاریە ڕاست و درووستە .

**ابن حامد** « ٤٠٣ هـ » دەڵێ : جا قسەکردن سەبارەت بە الإستواء ئایا لە سیفاتی زاتە یان لە سیفاتی فیعلە ؟

هەموو ڕیوایەتەکان لە أحمد ـەوە : لەسەر ئەوەن کە لە سیفاتی زاتە لە پێگەی وەسفی ئەو و توانا و گەورەیی ئەوە .

**وە یوسف بن موسی** « ٢٥٣ هـ » دەڵێ :

ووترا بـە أحمـد : اللہ تعالـی لەسـەروو ئاسمانـی حـەوتەمەوەیە لەسەر عەرشەکەی هیچ شتێک لە زانستی ئەو خاڵی نابێت؟ جەختـی لەسـەر ئـەوە کـردەوە و تەکفیـری ئەو کەسەشـی کـرد کـە پێچەوانـەی دەکات.

**ابن حامد** « ٤٠٣ هـ » دەڵێ :

وە من کتێبێکی التميمي ـم بینی سەبارەت بەم بابەتە ئەوەی باسمان کرد ئەو لە أحمد ـی گێڕاوەتەوە وە ووتی : بەڕاستی ئەوەی لێوەی هاتووە ئاماژە دەکات بەوەی کە ئەوە لە سیفەتی فیعلە .

[تحفة الوصول الى علم الأصول لابن المبرد ص٨٣]

**أبو الفضل عبد الواحد بن عبد العزيز التميمي** « ٤١٠ هـ » دەڵێ :

ئیمام أحمد « ٢٤١ هـ » دەیووت : اللہ دوو دەستی هەیە ئەوانیش سیفەتن لە زاتیدا ... هتد ووتەکە.

[الاعتقاد الامام المنبل أبي عبد الله أحمد بن حنبل ص ٢٢]

هـەروەها دەڵـێ : وە دەیفـەرمـوو : الله تعالى تـوانایەکـی هەیە سیفەتـی زاتیەتی.

[الاعتقاد الامام المنبل أبي عبد الله أحمد بن حنبل ص ٢٥]

هەروەها دەڵێ : دەیفەرموو : الله تعالى بەردەوام خاوەن وویست بووە ، وە وویستـن سیفەتێکە بـۆی لە زاتیـدا ، پێچەوانـەی ئەوانەی پـێ کـردووە کـە وویستیان نییە .

[الاعتقاد الامام المنبل أبي عبد الله أحمد بن حنبل ص ٢٧]

هەروەها دەڵـێ : وە دەیفەرموو : الله ﷻ کەلامێکی هەیە کە ئەو قسەی پێ ئەکات ، وە ئەویش سیفەتێکە لە زاتیدا ... هتد ... ووتەکە .

[الاعتقاد الامام المنبل أبي عبد الله أحمد بن حنبل ص ٢٨]

هەروەها دەڵـێ : وە دەیفەرمـوو : الله ﷻ ئیستوائـی هەیە لەسەر العرش المجيد ، جا کۆمەڵێک لێی دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی : الإستواء لە سیفاتی فیعلە ، وە کۆمەڵێک لێی دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی : لە سیفاتی زاتە .

[الاعتقاد الامام المنبل أبي عبد الله أحمد بن حنبل ص ٢٧]

شوێنـی شاهیـد لێرە ئەوەیە کە ئەسڵێکـی هەبووە بەکارهێنانـی سیفەتـی زات و سیفەتـی فیعل ئەگەرچـی بەم دەستەواژەیەش نەبێـت بـە تـەواوی و جیاواز بێت بەڵام مەبەستەکە هەر هەبووە والله أعلم.

**ئیمام عثمان بن سعید الدارمي** « ٢٨٠ هـ » به موعاریزەکەی دەڵێ:

وە تۆ بانگەشەی ئەوەت کـردووە کە پەرستراوەکـەت کەڕە نابیستێت ، لاڵە ناتوانێت قسـە بکات ، کوێـرە نابینێت ، گۆجە دەستـی نییە ، دانیشتـووە هەڵناستێتەوە و ناجوڵێت ، نەزانە و نازانێـت ، نەبووە و ڕۆشیتووە و وەسـف ناکـرێـت بـە حـەدد و نەفـس ، وە پێنازانرێـت « هەستی پـێ ناکرێـت » بـە هەستەوەرەکان ، وە ئەوەش پێچـەوانەی سیفەتی رب العالمین ــە .

[النقض ١٦٠]

الدارمي دەڵـێ الله ئەمانەی نییە بەڵکـو پێچەوانـەی ئەمانـەی هەیە واتە پێچەوانەی ئەم شتانەی ئەم جەهمیە باسی کرد وەک ئەوەی : الله قسە دەکات ، زانستـی هەیە دەبیستـێت و دەبینێـت و هتد .. ئێ الدارمي رحمه الله ئەمانە بە سیفەتـی رب العالمیـن ناودەبـات ، لـە کاتێکـدا ئەمانە کـارن و ئەنجـام دەدەرێـن جا لازم بن یاخود متعدي.

**فضیل بن عیاض** « ١٨٧ هـ » دەفەرمـێ :

ئەگەر جەهمیەک پێـی ووتـی مـن کافرم بـە پەوەردگارێک دادەبەزێت لە ئاسمانێکەوە بۆ ئاسمانێک ، ئەوا تۆ بڵێ من باوەڕم بە پەرەوەردگارێک هەیە کە ئەوەی وویستی لێی بێت ئەنجامی دەدات .

[عقیدة السلف وأصحاب الحدیث ص٢٢٨]

ئەم ووتەیەی فضل بن عیاض بەڵگەیە لە دژی ئەو جەهمیانەی سیفاتی فیعلـی الله نەفـی دەکەن ، جا دابەزینـی الله ﷻ سیفەتـی الله ـیە و لە کـە ئەنجامی دەدات ئەوە خۆی کارێکی کردووە ، بۆیە پێی دەوترێ سیفەتێکە کە الله ئەنجامی دەدات و پێـی وەسف دەکرێـت ، هەروەک بە ڕوونـی دەری ئەخات کە ئەهلـی سوننە باوەڕیان وایە کـە دابەزیـن لە سیفەتـی فیعلـی الله ـیە چونـکە پەیوەستە بە وویستی الله وە ﷻ.

**اسحاق بن راهویه** « ٢٣٨ هـ » رحمه الله دەڵێ :

وە بێ گومان الله تبارك وتعالى وەسفی خۆی کردووە لە کتێبەکەیدا بە سیفەتانێک کە خەڵکی بێ نیاز بوون لەوەی وەسفی بکەن بە جگە لەوەی ئەو وەسفی خۆی پێ کردووە ، لەوانە : فەرمایشتی : ﴿أَن يَأْتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِى ظُلَلٍ مِّنَ ٱلْغَمَامِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ﴾ [البقرة ٢١٠]

[السنة لحرب الكرماني ٣٤٧]

ئەم ئایەتە کە إسحاق رحمه الله بەڵگەی پێ هێنایەوە بۆ جێگیر کردنی سیفەتێک لە سیفەتەکانی الله سیفەتی هاتنی الله ـیە ئەمەش مەعلومە کە هاتنی الله لە کرداری الله ـیە و ئەو ناوی ناوە سیفەت .

**الخلال** « ٣١١ هـ » دەڵێ :

محمد بن سلیمان هەواڵی پێدام : کە وتوویەتی بە أبو عبد الله أحمد بن حنبل : چی دەڵێی دەربارەی قورئان ؟

ئەویش ووتی : دەربارەی چ شتێکی دەپرسی ؟

ووتم : کەلامی الله ـیە

فەرمووی : کەلامی الله ـیە و مەخلـوق نییـە ، وە نەشڵەژێـی لەوەی کە بڵێی مەخلوق نییە ، **چونـکە کەلامـی الله لە الله ـیە ، وە لە زاتـی الله ـیە ، وە الله قسەی پێ کردووە ، وە هیچ شتێک لە الله مەخلوق نییە .**

[السنة للخلال ١٨٣٤]

سەرنج بدە کەلامی الله کە کەس گومانی نییە لەوەی سیفەتی الله ـیە ئیمام أحمد ئەفەرمـێ لە زاتـی الله ـیە و لە الله ـیە ﷻ و قسـەی پـێ کردووە ، واتە لە سیفەتی زاتـی فیعلیە کە پەیوەنـدی بە وویستـی الله ـیەوە هەیە بۆیە هەرگیز نابێتە مەخلوق.

**أبو حنبل دەڵێ :**

لە أبا عبد الله ـم بیست دەیووت : الله ﷻ لە کتێبەکەیدا دەفـەرمـێ :

﴿وَإِنۡ أَحَدٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ۝٦﴾ [التوبة]

جا جبریـل لـە الله ـی بیستـووە ، وە پێغەمبـەر لـە جبریـل ـی بیستـووە

وە هاوەڵانی پێغەمبەر لە پێغەمبەریان بیستووە ﷺ ، وە قورئان کەلامی الله ـیە و مەخلوق نییە ، وە گومانمان نییە و ڕاڕا نین تێیدا ، وە ناوەکانی الله لە قورئاندا وە وەسیفەتەکانــی لە قورئاندا لە زانستی الله ـن ، وە سیفەتەکانــی لەوون « واتە لە زاتی الله ».

[السنة للخلال ١٨٤٧]

ئیمام سیفەتەکان کە لە قورئاندا هاتوون دەیانداتە پاڵی الله و دەڵێ لە زاتی الله ـن.

**البخاري** « ٢٥٦ هـ » دەڵێ :

زانایان دەڵێن : درووستکـردن کردەوەی الله ـیە ، وە کار و کـردەوەکانــی خۆمان مەخلوقن بە فەرمایشتی تعالی : ﴿وَأَسِرُّوا قَوْلَكُمْ أَوِ اجْهَرُوا بِهِ ۖ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ واتــە لـە پەنهـان و ئاشکـرا لـە ووتەکە ، جا ئەنجامـدانــی الله سیفەتــی الله ـیە ، وە ئەنجـام دراوەکە جگـە لـەوە لـە مەخلوقەکان .

[خلق أفعال العباد ٢ / ٣٠٠]

هەروەها دەڵێ : بە هەمان شێوە هەموو قورئان ووتەی ئەوە « واتە : الله » وە ووتەکەش سیفەتی بێژەرەکەیە ، وە بێژەرەکە پێی وەسف کراوە .

[خلق أفعال العباد ٢ / ٣٠١]

البخاري کـردەوەکانـی الله بـە سیفەتـی الله ناو دەبـات ئەو شتانـەی الله ئەنجامیان دەدات وەکو قسە کردن و فەرمایشتەکانی الله دەڵێ کردەوەی الله ـن و سیفەتی الله ـن ، ئیدی ئەمە خـودی ئـەو تێهەڵکێش کراوەیە کە ئێمـە بەکاری دەبەین .

هەروەها بـابێکـی داناوە لـە صحیح ـەکەی بەناوی : بابـی ئەوەی کـە هاتووە سـەبارەت بە دروستکردنـی ئاسمـانەکان و زەوی و جگـە لەوان لە دروستکراوەکان ،وە ئەوەش کــردەوەی پەروەردگــارە و فـەرمـانیەتـی ، جـا پەروەردگـار بە سیفەتەکانیەوە و فەرمانەکانیەوە ئەو بەدیهێنەری گەردوونە.

واتە : خەلق دروستکردنی الله بۆ ئاسمانەکان و زەوی کە ئەمە سیفەتی الله ـیە بەهەمان شێوە کار و کـردەوەی الله یە ئەم دروست کردنە ، بە کورتـی ئەیەوێت بڵێ ئەمە سیفەتی فیعلی الله ـیە بەڵام بەسەریەکەوە نایڵێت .

وە ووتەیـەک هەیە کـە زۆرێـک لـە سەلەف دەیڵێنـەوە ئەویـش ئەوەیە کـە دەفەرمـوون : قـورئان کەلامـی الله ـیە وە لەویشە و مـەخلـوق نییە ، یـان لێـی دەرچووە یان قسەی پێ کردووە الله و هتد لەم عیبارەتانە.

کـە دەڵێـن لەوە و لێـی دەرچـووە ئەمە ئیسباتـی سیفەتـی زات و فیعلە بەیەکەوە ، یەکەم کە دەڵێن لەوە واتە بەشێکە لێی واتە بەشێکە لە زات وە کە دەڵێن لێی دەرچووە یان قسەی پێکردووە ئەمە ئیسباتی سیفەتی فیعلیە بۆ الله چونکە ئەمەی کە دەڵێن لێوەی دەرچووە یان قسەی پێ کردووە ئەمە واتە

الله کارێکی ئەنجام داوە کە پەیوەستە بە وویستی خۆیەوە .

## کۆتـایـی :

بۆیە باوەڕمان بەوە هەیە کە الله دەستی هەیە وە باوەڕمان بەوەش هەیە کە بە دەستی ئەنجامی دەدات لە نووسین و گرتن و هتد ...وە پێیان وایە ئەم دوو سیفەتە جیاوازن یەکەم سیفەتێکە لە الله جودا نابێتەوە کە دەستیەتی ، بـەڵام دووەم بـەو شێـوەیە نییە بەڵکـو کارێـکە ئـەنجامـی دەدات کاتێـک دەرئەکەوێ کە وویستـی خۆی لەسەرە گەرچـی بـە هێزی خـۆی بەردەوام لەگەڵیشی بێت بەڵام کاتێک دەردەکەوێ کە دەیەوێت ئەنجامی بدات.

وە بڕوامان بەوە هەیە کە الله پەنجەی هەیە وە بڕوامان بە هەموو ئەو شتانە هەیە کە بە پەنجەکانی ئەنجامیان ئەدات ، لەوانە هەڵسوڕاندنی دڵی بەندەکانی بە وویستی خـۆی ، وە بڕوامان وایە هەڵسوڕاندنی دڵـی بەنـدەکان بـە دوو پەنجەکـەی لەگـەڵ خـودی دوو پەنجـەکـەی خـۆی دوو سیفەتـی جیـاوازن هەڵسوڕاندنەکە کارێکە ئەنجامـی ئەدات و پەیوەسـتە بەویستـی خۆیە و هەندێ جار ئەنجامی ئەدات و هەنێ جاریش نا ، بەڵام پەنجەکانی کارێک نییە ئەنجامی بدات بەڵکو بەوان کارێک ئەنجام ئەدات وە بەردەوام لەگەڵیەتی و جودا نابنەوە لێی.

وه بڕوامان بەوه هەیه كه الله دوو چاوی هەیه وه بڕوامان بەوه هەیه كه پێیان دەڕوانێ ، وه بڕوامان بەوه هەیه كه ڕوانینی غەیری چاوەكانیەتی ، چاوەكانی هیچ كات جودا نابنەوه لێی بەڵام ڕوانینی بەو شێوەیه نییه بەڵكو ئەشێ هەندێ جار نەڕوانێ بۆ نموونه سەیری كەسانێک ناكات له بێباوەڕان له ڕۆژی دواییدا ، وه ڕوانینەكەی له كارەكانیەتی به وویستی خۆی ئەنجامی ئەدات .

هذا والله أعلم وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم